**جێنـــدەر و فێمـــێنـیزم**

نووسینی : صــلاح الــدین أحــمد

نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: زەردەشت کاوانی

ساڵی چاپ : یەکەم / ١٤٤٤ ك – ٢٠٢٣ ز

پێوانـــــــە: ١٤ × ٢١

## بەناوی خوای گەورەی بەخشندەی میهرەبان

دۆز و پرس و باسی ئافرەت باسێکی گرینگ و گەرمە و قسە و باسی زۆری لەبارەوە دەکرێت، یەکێ لە بابەتە هەرە گرینگ و گەرمەکانیش پرسی (جێندەر) و (فێمێنیزم)ە، کە لەم دواییانەدا زۆرترین قسە و باسی بەدوای خۆیدا هێنا، بەڵام ئەوەی جێی داخە زۆربەی ئەو تەوژمانەی دێنە مەیدان یەکەم شتیان دژایەتیکردنی ئایین و ئەخلاق و عورفی جوان و ڕەسەنایەتییە! ئینجا ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لە کۆتاییشدا هەمووی بە زەرەر و زیانی ئافرەتان کۆتایی دێت و ئافرەتان تووشی نەهامەتی و داڕووخان و نامۆبوون بە کۆمەڵگە و خێزان دەکەن و تووشی دەیان کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتی دەبن، دواییش خۆیانی لێ بەری دەکەن و بەتەنها جێیان دێڵێن! هەر بۆیە دەیان و سەدان ژنیان تووشی کوشتن و خۆکوژی کردووە! کۆمەڵگەی موسڵمانان لە بەرنامە و یاسا و بۆچوونی جوان و دادگەرانە بەرامبەر ئافرەت پەکیان نەکەوتووە و ئیسلام پڕیەتی لە یاسا و ڕێسا و سنووری جوان و گونجاو بۆ ئافرەتان، ئەوە دەستەڵاتە ستەمکارە عەلمانی و غەیرە عەلمانییەکانن جێبەجێیان ناکەن، کەواتە خەتایەکە لە دەستەڵاتی سیاسی و دادوەری و جێبەجێکارە کە یاساکان جێبەجێ ناکەن، هەتا یاساکانی باری کەسێتیش کە زۆربەی لە ئیسلام وەرگیراون و خۆیان دایان ناوە جێبەجێیان ناکەن، بۆیە لە

جیاتی ئەو هەمووە شیوەن و فرمێسکە درۆینانەی بۆ ئافرەت دەیڕێژن با بچن بە گژ ئەو دەستەڵاتە ستەمکارانەدا بچنەوە، کە مرۆڤیان بە ئاژەڵ کردووە ئافرەتیان کردووە بە کاڵایەکی زۆر بێ نرخ و سووك!

**٣١/ ١٠/ ٢٠٢٢ ز**
**ڕانیـــــــــــــــــــه**



## جێندەر (gender)



وشەی جێندەر (gender) (النوع الاجتماعي) (جۆری کۆمەڵایەتی) وشەیەکی ئینگلیزییە، سەرچاوەی ئەم وشەیە، لە (gendre)ی ئینگلیزیی چاخی ناوەندەوە هاتووە، ئەم تێرمە لەزمانی فەرەنسیی کلاسیکەوە وەرگیراوە و ڕیشەی ئەم تێرمە لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ (genus)ی زمانی لاتینیی.

(gender) لە زمانی ئینگلیزیدا بە مانای؛ جۆر (kind) بەکاردێت، کە لە بنچینەدا لە وشەی(gen) زمانی هیندۆئەوروپییەوە وەرگیراوە. سەرچاوەی وشەگەلی وەك : (kin، king، kind) چەندین وشەی دیکەیە لە زمانی ئینگلیزیدا. لە زمانی فەرەنسیدا وەك وشەی ((genre genre sexuel)) سەریهەڵداوە کە لە بنچینە یۆنانییەکەوە وەرگیراوە (gen)، لە وشەگەلی وەك (gene)، (genesis)، (oxygen) دەبینرێت.

(جێندەر) لە ڕووی زمانەوانییەوە بەمەبەستی جیاوازی و لێکدانەوەی سرووشتی تایبەتمەندی نێوان (نێر و مێ) بەکاردەهێنرێت. ئەم وشەیە، بەپێی ئۆرگانیەتی دەلالی چەمکەکە خۆی، گوزارشتە لە جۆر و سروشتی (نێر و مێ) بە شێوازێکی فراوان بەکاردەهێنرێت، لە بواری کلتووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا.

وشەی جێندەر لە ڕەگەزە ڕێزمانییەکاندا، سەرەتا بۆ ( جیاوازی نێوان تاك و کۆ) بەکارهێنراوە. تا ساڵانی ١٩٥٥ز « جۆن مۆنی John Money»جیاوازییە چەمکییەکانی نێوان ڕەهەندە بایۆلۆجییەکانی ڕەگەز و ڕۆڵی جێندەر دەخاتە ڕوو. هەرچەندە ڕیشەی جێندەر و وەکو ڕەهەندێکی بایەلۆژی لە ئینجیلیدا بەکارهاتووە، (تۆ نابێت ڕێگە بدەیت بە ئاژەڵەکانت زاوزێ لەگەڵ جۆری جیاواز لە خۆیان بکەن.)

جێندەر: (دروستکراوێکی کۆمەڵایەتیە، گوزارشت و نوێنەرایەتی و لێکدانەوەی تێگەشتنەکانی نێوان «نێر و مێ» دەکات).

جێندەر بەواتای جۆر یان ڕەگەز دێت، لە بیرکردنەوەی کۆمەڵەکی و لە خەیاڵو خەیاڵدانی تاکەکانی کۆمەڵگاوە، دێتە بەرهەم.

بەجۆرێکی تر، «جێندەر» زادەی بیرکردنەوەی تاك و گروپە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگایە. ئەم چەمکە گوزارەیەکی کۆمەڵایەتیە، خۆی لە جیاکاری ڕەگەزی (نێر و مێ) دا، دەبینێتەوەو بەهۆی شێوازەکانی بەرهەمهێنان و ئەو گۆڕانانەی بەسەر شێوازەکانی بەرهەمهێناندا هاتوون، ڕەنگدانەوەی بەسەر بیرکردنەوەی مرۆڤدا، جیاوازی جۆر تۆختر دەبێتەوەو لە ئاستی جیۆپۆلیتیکی و کلتوور و ئەدەبیات و شارستانییەتەکاندا، گۆڕانی بەسەردا دێت.

سەرهەڵدانی چەمکی جێندەر بۆ نێو ڕەهەندە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی بزوتنەوەی فێمێنیزم لە

شەستەكانی سەدەی نۆزدەهەمدا. چیتر ژن وەكو پرسێكی گەورەی جیهانی، پانتاییەكی سیاسی و كلتووری و كۆمەڵایەتی داگیر دەكات. دەبێتە كائینێكی كۆمەڵایەتی بەشداری دەكات، لە كایەی سیاسی، بەڕیوبەری و بیۆكراتی و سوپا و دامەزراوەكانی دەوڵەت.

فێمێنیستەكان چـــەمكی جێندەر بۆ تێگەشتن و لێكدانەوەكانی پەیوەندی نێوان (نێر و مێ)بەكاردەهێنن.

«سیمۆن دی بۆڤوار» ژنە فەیلەسووف و فمینیستی فەڕەنسی، لە كتێبی (ڕەگەزی دووەم)دا، بەم شێوازە بۆ چونەكانی خۆی دەردەبڕێت و دەڵێت؛( هیچ ژنێك بەژنی لە دایك نابێت، بەڵكو دەكرێت بەژن.)

لەدیدی «سیمۆن دی بۆ ڤورار»ەوە، بیركردنەوەی تاكەكان لە ڕووی كلتووری و كۆمەڵایەتییەوە بۆیان ماوەتەوەو، مێینەیی خەسڵەتێكی بۆماوەیی نیە و هیچ ژنێك بەژنی لە دایك نابێت، بەڵكو بەدرێژای پرۆسەی بەكۆمەڵاییەتی بوون و بەرهەمهێنانەوەی مرۆڤ لەلایەن دەستگا كۆمەڵایەتییەكانەوە، پێناسەی خۆیان بەسەریاندا دەسەپێنن و پیاوان وێنەی خۆیان بەزاڵی دەهێڵنەوە. «دیبۆڤوار» ئاماژە بەوە دەكات بەدرێژایی مێژوو ژنان لە كۆمەڵگادا بە چاوێكی نزمتر تەماشایانكراوەو لە كاتێكدا هیچ كەسێك بەژنی یان بەپیاوی لە دایك نابێت.

لەگەڵ دەركەوتنی شەپۆلی دووەمی فیمینیزم ئەم چەمكە پانتاییەكی فراوانی داگیركرد، بۆ داكۆكیكردن لە یەكسانی جۆر و ڕەگەز. سەرەتا

ئەم چەمکە بەشێوازێکی دینامێکی وەکو ئاکتێکی شۆڕشگێڕانە لەلایەن بزوتنەوەی فیمینزمەوە بەکاردەهێنرا، بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان شانبەشانی پیاوان و بەشداریکردنیان لە پێکهێنانی کۆمەڵگادا وەکو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی. فیمینزمەکان چەمکی جێندەریان بەکاردەهێنا، بۆ ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی پەیوەندییەکانی (نێر و مێ)، هاوکات لە ژێر ڕۆشنایی ئەم چەمکەدا داکۆکیان لە یەکسانی جێندەری دەکرد، واتا؛ جیاوازی نەکردن لەنێوان (نێر و مێ)دا، لە ئەرك و مافدا[١].

---

(١) https://www.regaykurdistan.com/index.php/wtar/37597

## پوختەی بنەما فکرییەکانی جێندەر

**١.** نەهێشتنی نێرایەتی و مێیایەتی، چونکە پێیوایە نێری و مێی دەستکردی کۆمەڵگەیە.

**٢.** جێندەر هەستکردنی مرۆڤە بە مێیایەتی یان نێرایەتی (واتە هەستکردنی مرۆڤە بە ڕەگەز)، واتە شتێکە مرۆڤ خۆی دەیخولقێنێت، نەك لە حەقیقەتدا وابێت، بۆیە بۆی هەیە بە جەستە پیاو بێت، بەڵام ناسنامە جێندەرییەکەی ژن بێت، یان بەپێچەوانەوە، واتە پیاو ڕۆڵی ژن ببینێت و ژن ڕۆڵی پیاو ببینێت.

**٣.** نابێ جیاوازی بایۆلۆجی ببێتە هۆی دیاریکردنی ئەرك و ماف و ڕۆڵ، بۆنموونە پیاو کە هەستی مێ بوونی هەبوو بۆی هەیە شوو بکات و نابێ هیچ کەسێکیش سەرکۆنەی بکات لە هەڵبژاردنی ئەم ناسنامە جێندەرییە بۆ خۆی.

**٤.** جۆرەکانی هاوسەرگیری و زەواج و خێزان یەك جۆر نیین، بەڵکو دەیان جۆریان هەیە، پیاو و ژن، ژن و ژن، پیاو و پیاو، پیاو و ئاژەڵ، ژن و ئاژەڵ، ....

**٥.** کەواتە ڕەگەزی بایەلۆجی و جۆری کۆمەڵایەتی لەلای جێندەر جیاوازە و نابێ ڕەگەزی بایەلۆجی ڕۆڵی هەبێ لە دیاریکردنی ئەرك و ماف و ڕۆڵ، هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان نێر و مێدا.[١]

---

(١) اللجنة الإسلامية العالمية للمرأة والطفل، اتفاقية القضاء على كافة أشكال

بەڵام لەتێڕوانینی ئیسلامدا بەهیچ شێوەیەك ئەم بۆچوونە جێی نابێتەوە، چونکە نێر نێرە و مێ مێیە، نەك خۆیان یان کۆمەڵگە بۆیان دیاری بکات، واتە شتێکی حەقیقی و زاتییە و لە بنەڕەتەوە هەیە و هیچیشیان فەزڵ و جوان و چاکە و... نییە بەرامبەر ئەویتریان، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:

(وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ)[1]

واتە: هەر ئەو زاتەش (خودا) دوو جۆری دروست کردووەکە نێر و مێیە ....

---

التمييز ضد المرأة، مرجع سابق، ص ص ١٠٦_١٠٧ ومادة ((جندر)) ، استرجعت بتاريخ ٢٠٢٣/٤/١٥م من موقع الموسوعة البريطانية

http://www.britannica.com/EBchecked/topic/٢٢٨٢١٩?gender-identity

صندوق الأمم المتحدة الإنمائي للمرأة، مسرد مفاهيم ومصطلحات النوع الاجتماعي، ط ٤، (عمان: المكتب الإقليمي للدول العربية، ٢٠٢١م) ص ٤ _ ٥ _ ٦.

الأمم المتحدة، تقرير المؤتمر الدولي للسكان والتنمية القاهرة ٥ _ ١٣ أيلول/ سبتمبر ١٩٩٤م، (نيورك: منشورات موقع الأمم المتحدة، ١٩٩٤م) ص ١٣.

الأمم المتحدة، نظام روما الأساسي للمحكمة الجنائية الدولية ١٥ _ ١٧ تموز/ يوليه ١٩٩٨م، (نيورك: منشورات موقع الأمم المتجدة، ١٩٩٨م)، ص ٨.

(١) النجم ( ٤٥ )

(وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ)[١]

واتە: سوێند بەو زاتەی کە نێر و مێی دروست کردووە.

نەك هەر ئەوەندە بەڵکو خۆچواندنی نێر و مێش بەیەکدی دروست نییە[٢]، چونکە هەردووکیان تایبەتمەندی خۆیانیان هەیە، تایبەتمەندی دەروونی، جەستەیی، فسیۆلۆجی، کۆمەڵایەتی، ....، بۆنموونە ئافرەت لەڕووی جەستەییەوە مەمکی هەیە بۆ شیردان، وە منداڵدانی هەیە بۆ هەڵگرتنی منداڵ، وە هەروەها هێلکەدان و .... هەیە، ئینجا وەك پیاو موودار و دەنگگڕ و .... نییە، بەهەما شێوە لە ڕووە دەروونیەکەشەوە زۆر جیاوازە، ئەو نەرمونیان و ناسکی و ڕەحم و .... خوای گەورە داویەتی بە ئافرەت بۆ ئارامگری لەسەر ناڕەحەتییەکانی حەمڵ و بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵ نەیداوە بە پیاو، بەهەمان شێوە زۆر شتیشی داوە بە پیاو کە نەیداوە بە ژن، ئەم تایبەتمدیانەش هەر لە خۆیان جوانە و یارمەتیدەرێکی زۆر گەورە و گرنگیشە بۆ ڕاییکردنی کار و ئەرك و ڕۆڵەکانیان.

---

(١) الليل ( ٣ )

(٢) البخاري، أبو عبد الله محمد إسماعيل، صحيح البخاري، ط١، (دمشق: دار ابن كثير، ١٤٢٣ هـ ـ ٢٠٠٢م)، ح ٥٨٨٥، كتاب اللباس، باب المتشبهون بالنساء والمتشبهات بالرجال، ص ١٤٨٥.

ئەم جیاوازی ڕەگەزییە هەر بۆ مـــرۆڤ نییە، بەڵکـــو هەموو بوونەوەرەکان بەم شێوەیە دابەش بوون، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ)[1]

واتە: لەهەموو شتێك ئێمە جووتمان دروست کردوە (لەجیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕوەك و بێ گیاندا، لەهەموو شتێکی ماددی و مەعنەویدا) بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و یادەوەری وەربگرن.

بۆیە ئەگەر بڕوانینە ژیانی ژیاندارانیش زۆر بەڕوونی هەردوو ڕەگەز دەبینین و هەر یەکەشیان ئەرك و ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت. کەواتە ئەوە شتێکی فیتری و زگماکی و خوداییە و لادان لێی لادانە لە سروشت و فیترەت و ئەسڵ و چوونە بەرە و داڕووخان و لێکهەڵوەشان و .....

بۆیە لە ئیسلامدا هەر دوو ڕەگەزەکە درووستکراوی خودان و هیچیان باشتر و گەورەتر و بەنرختر نیین، تەنها پێوەرێك بۆ گەورەیی و باشی و جوانی و بەرزی شتە مەعنەوییەکان و ئەخلاق و ڕەوشت و بەهای باڵاکان و ئیمان و تەقوایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾[2] واتە: (بەڕێزترینتان لە لای خودای گەورە ئەو کەسەتانە کە لە خودا ترستر و خۆ پارێزتر و فەرمانبەردارترە).

---

(١) الذاريات ( ٤٩ ).

(٢) الحجرات ( ١٣ ).

کەواتە لێرەدا خودای گەورە تەرازو و پێوانەی خۆی بۆ ڕوون کردووینەتەوە، کە باشترین و بەڕێزترین کەس لای ئەو، ئەو کەسەیە کە زیاتر لەخوداترس و خۆپارێز و فەرمانبەری خودایە، کەواتە پێوانەکە ڕەگەز و ڕەنگ و دەنگ و عەشیرەت و جوانی و زانست و دەوڵەمەندی و خانەدانی و دەسەڵاتداری و بەناوبانگی و......، نییە، بەڕاستی ئەو یاسایە ئەگەر لێی تێبگەین بەسامانە، چونکە خودای گەورە شتێکی وای داناوە و کردویەتیە پێوەر، کە هەموو کەسێك پێی دەکرێت، هیچ کەسێك نییە پێی نەکرێت، بۆیە شوانێك لەو شاخانە زۆر زۆر بەئاسانی دەتوانێت ئەو پلەیە بەدەست بهێنێت، وە هەروەها هەژارێك یان کۆڵهەڵگرێك (حەمباڵێك) یان نەخوێندەوارێك یان پەککەوتەیەك یان خاوەن پێداویستی تایبەتێك یان......، هەر هەموویان زۆر بەئاسانی دەتوانن ئەو پلەیە بەدەست بهێنن، بۆیە خودای گەورە ئەگەر دەوڵەمەندی دانابایە ئەوا بەس دەوڵەمەندەکانمان ئەو پلەیەیان بەدەست دەهێنا، وە ئەگەر زانستی بە پێوەر دانابایە ئەوا بەس زاناکان ئەو پلەیان بەدەست دەهێنا، یان ئەگەر ڕەگەزی دانابایە .... بەڵام ئێستا هەموو کەسێك دەتوانێت ئەو پلەیە بەدەست بهێنێت!

##  مێژووی جێندەر 

بۆ یەکەمجار لە کۆنگرەی قاهیرە، ساڵی ١٩٩٤ دا بە ڕەسمی بەکارهێنراو سەپێنرا، دواتر لە کۆنگرەی پەکینی ساڵی ١٩٩٥، دواتر لە دەیان کۆنگرەی تەندروستی و گەشەپێدان و نیشتەجێبوون و ... ناوی هاتوو و بووە دەستەواژەیەکی بەربڵاو، بەڵام لە سەرەتای بەکارهێنان و دەرکەوتنیدا زۆر ناڕوون بووە، بەشێوەیەك ئەوانەی بەکاریشیان هێنا نەیاندەزانی مانای دەقیقی چییە! بۆیە لیژنەی پێناسە لە کۆنگرەی چواری تایبەت بە ئافرەت کە لە پەکین بەسترا لە ساڵی ١٩٩٥ز، بڕیاریدا پێناسەی نەکات (The non definition the term Gender)[١]. واتە ماوەیەی چەند ساڵێك _ کە بەکاریش دەبرا _ پێناسە نەکرابوو.

### ئامرازەکانی بڵاوبوونەوە

جێندەر لە کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا لەڕێی ڕێکخراوە نێودەڵەتییەکان و ڕێکخراوە حکومی و ناحکومییەکان و پاڵپشتی دارایی دەرەکی و پەیمانگا و دامەزراوەکانی توێژینەوە و ڕاگەیاندن بڵاوکرایەوە.

---

(١) الكردستاني، مثنى أمين، وحلمي، كاميليا، الجندر المنشأ - المدلول - الأثر – عمان، جمعية العفاف الخيرية، ١٤٢٨ه=٢٠٠٨م)، ص ٥٠.

## ئامانج و کاریگەرییەکانی جێندەر

جێندەر بۆ ئامانج و مەبەستگەلێکی ترسناك دروستکراوە و بڵاوکراوەتەوە و دەکرێتەوە، تاوەکو ئەم کاریگەرییە نەرێنیانەیی ببێت:

### کاریگەریە ڕۆشنبیری و فکریەکان

**١.** گومان خستنە سەر بنچینەکانی ئیسلام، بۆنموونە گومان خستنە سەر قورئان، بێڕزیکردن پێی و بانگەوازیکردن بۆ ڕاڤەی لاڕێ و لادەر بۆ دەقەکانی قورئان، وە هەروەها گومان خستنە سەر فەرموودە و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و سوکایەتی پێکردن و ڕەخنەگرتن لێی و گومان دروستکردن لەسەر زاتی پێغەمبەر ﷺ بەوەی کە مافی ژنی خواردووە و .....

**٢.** شێواندنی فیقهی ئیسلامی و نەهێشتنی شتێك تایبەت بە ڕەگەزی ئافرەت، وەك حیجاب و واجبە شەرعییەکانی تایبەت بە ئافرەت و ...

### کاریگەرییە کۆمەڵاتییەکان

**١.** ڕەخنەگرتن لە سیستمی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا و هەوڵی ناشرین کردن و ناساندنی وەك دواکەوتوویی و ....

**٢.** ڕەخنەگرتن لە خێزان و هەوڵی تێکدان و لێکهەڵوەشاندن و شێواندنی.

**٣.** دژایەتیکردنی زەواج و هاوسەرگیری ئیسلامی و هەوڵدان بۆ ناشیرینکردنی و داهێنانی زەواجی دیکەی وەك پیاو و پیاو و ژن و ژن و ئاژەڵ و ژن و پیاو و ئاژەڵ.

**٤.** دژایەتیکردنی هاوسەرگیری لە تەمەنێکی زوودا.

**٥.** دژایەتیکردنی چەند ژنی و ناشیرنکردنی.

**٦.** دژایەتیکردنی هەموو ڕۆڵەکانی ژن و پیاو لە خێزان و کۆمەڵگەدا و بنیاتنانەوەی بەشێوەیەك کە هیچ سنورێك بوونی نەبێت لە ئەرك و ماف و ڕۆڵدا، ڕۆڵەکان بەدیارینەکراوی دەهڵێتەوە.

**٧.** دژایەتیکردنی مارەیی و تەڵاق هەموو دەستەواژە و سنوورە شەرعییەکان.

**٨.** نەهێشتنی ڕۆڵی ئافرەت وەك دایك و هاوسەر و خێزان و کردنی بە مرۆڤێك ناجیاواز لە پیاو.

## کاریگەرییە ئەخلاقییەکان

**١.** نەهێشتنی شتێك بە ناوی ئەخلاق و بە ڕێژەیی کردنی، بۆنموونە هاوڕەگەزبازی بەهیچ شێوەیەك شتێکی نا ئەخلاقی نییە، یان زەواجی ژن و پیاو لەگەڵ ئاژەڵ شتێکی ئاساییە و ناکرێ بە نا ئەخلاقی وەسف بکرێت.

**٢.** بڵاوکردنەوەی مومارەسەی سێکسی لە دەرەوەی خێزان و ژیانی هاوسەری و ژن و مێردایەتیدا.

## کاریگەرییەکانی لەسەر پڕۆسەی فێرکردن

**١.** دووبارە داڕشتنەوەی پڕۆگرامی خوێندن لەسەر بنەما فکری و فەلسەفییەکانی خۆی.

**٢.** تێکەڵکردنی نێر و مێ و هاندان بۆ تێکەڵاوی بێ مەرج و سنوور.

**٣.** زیادکردنی فورسەی خوێندن بۆ ڕەگەزی مێ و بێئاگاکردنی لە ئەرکە گەورەکانی دیکەی.

## کاریگەرییە ئابوورییەکان

**١.** هاندانی ئافرەت بۆ ئابووری سەربەخۆ و واتێگەیاندنی کە دەبێ پارە و سامانی خۆی هەبێت و نابێ چاوی لە دەستی پیاو بێت، واتە نەفەقەی پیاو بە شتێکی خراپ دادەنێت و پێیوایە دەبێ هەرچۆنێ بێ و بە هەر ڕێگەیەك بێت ئافرەت لە ماڵ بێتەدەر و ببێتە خاوەن سامان، بەبێ ڕەچاوکردنی بارودۆخ و کەسایەتی و ئەرکی ئافرەت.

**٢.** بێکاری، بەهۆی تێکدانی شیرازەی کۆمەڵگە و هێنانەدەرەوەی هەموو ئافرەتان و کارپێکردنیان، بێکاری زۆر لە ناو پیاواندا دروست دەبێت، کە وا دەکات ڕێژەی زەواجیش کەم ببێتەوە، چونکە لە کۆتاییدا ئەوەی دەبێ کار بکات و پارە و بژێوی بۆ خێزان

پەیدا بکات پیاوە، کە پیاو هەلی کارکردنی نەما یان کەمبووەوە، ئەو کارەساتە دەخولقێت کە ئێستا خولقاوە، بەشێوەیەك خێزان و هاوسەرگیری نامێنێت و حەزە جینسی و سێکسییەکان لە دەرەوەی زەواجی شەرعی و خێزانی ڕەسەندا بەتاڵ دەکرێنەوە.

کەواتە بەکورتی و بەکوردی جێندەر هیچ حیسابێك بۆ جیاوازییەکانی ژن و پیاو و نێر و مێ ناکات و دەیەوێ لە ڕیشەو بناغەوە مانای نێرایەتی و مێیایەتی ڕشەکێش بکات و دواتریش هەموو ئەو شتانەی لەوەوە پەیدا دەبێت قبوڵیان نەکات و خێزان و کۆمەڵگە و ئەخلاق و ڕەسەنایەتی و عورف و بنەما کۆمەڵاتی و ئەخلاقییە جوانەکان و ئایین و ... لە ڕیشەوە هەڵکێشێت و مرۆڤ وەك ئاژەڵ و مەیمون لێبکات و کۆمەڵگەش بکات بە باخچەی ئاژەڵان و هیچ سنوورێکی ئایینی و شەرعی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی نەهێڵێت و هەموویان وەك شتێکی دواکەوتوو و دژە مرۆڤ وەسف بکات.

## فیمێنیزم (ژنۆلۆژی = مێگەری)

چەمکی فیمێنیزم (Feminism) (النسوية، النسوانية، الأنثوية) مێگەری، لە ئەسڵدا فەرەنسییە، لە وشەی  Femina)) ی لاتینی وەرگیراوە بە واتای (ئافرەت).

فیمێنیزم پێناسە و ناساندنی زۆری بۆ کراوە، بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین پێناسەیەکی گشتگیری بۆ بکەین:

فیمێنیزم بریتییە لە: بزوتنەوەیەکی فکری سیاسی کۆمەڵاتی فرە ڕەهەند و فرە تەوژم و فکر، لە کۆتاییەکانی شەستەکان سەریهەڵداوە، هەوڵدەدات بۆ گۆڕانکاری فکری و کۆمەڵایەتی ڕۆشنبیری نێوان هەر دوو ڕەگەزی نێر و مێ، بەشێوەیەك لە کۆتاییدا دەگاتە یەکسانی ڕەها لەنێوان نێر و مێدا، یان زاڵبوونی مێ لە کایەکانی ژیاندا و سەنتەربوونی، ئامانجەکانی بە پێی بنەما مەعریفییەکانی دەگۆڕێت، بنەما فکرییەکانیشی بە زێدەڕۆیی و توندڕەویی و لادان وەسفدارە، پشتگیری ململانێ و دووژمنایەتی نێوان نێر و مێ دەکات، هەوڵیش دەدات بۆ خوێندنەوەی نوێ لە ئایین و زمان و مێژوو و ڕۆشنبریی و پەیوەندی نێوان هەردوو ڕەگەز[١].

---

(١) الكردستاني، مثنى أمين، حركات تحرير المرأة من المساواة إلى الجندر، دراسة نقدية إسلامية، دار القلم للنشر والتوزيع، ط ١، ١٤٢٥هـ _ ٢٠٠٤م، ص ٥٣.

##  مێژووی فێمێنیزم 

مێژوویەکی دیاریکراوی تەواو تەواو نییە لە ئەدەبیاتی سەردەمی نوێدا بۆ دەرکەوتنی دەستەواژەی فێمێنیزم (Feminism)، هەندێ زمان هەر لە بنەڕەتدا دەستەواژەی فێمێنیزم (Feminism) ی تێدا نییە وەك دەستەواژەیەك کە گوزراشت لە سیاسەتی یەکسانی نێوان هەر دوو ڕەگەز بکات، دەوترێ بۆ یەکەمین جار لە بەریتانیا لە ساڵی ١٨٩٠ دا بەکارهاتووە، بەڵام لە ئێستادا بووە بە دەستەواژەیەکی بەربڵاو لە جیهاندا لە ناو هەموو زمانەکاندا، وەك ناونیشان بۆ هەموو ئەو بزوتنەوانەی بانگەشەی یەکسانی نێوان هەر دوو ڕەگەز دەکەن، یان دەیانەوێ ژن سەربەخۆیی تەواوی هەبێت و بەتەواوی لەژێر ڕکێفی کۆمەڵگە و پیاو و ئایین و ... بێتە دەر و هیچ سنوورێك نەبێت سنوورداری بکات. فێمێنیزم (Feminism) لە ئێستادا لە زۆربەی زمان و وڵاتاندا هەر بە هەمان شێوە بەکاردێت و بووە بە ناسنامە و ناونیشانی ئەم قوتابخانە و تەوژمە مێگەرییە.



## ئامانج و سەرەنجامە گشتییەکانی فێمێنیزم (Feminism) مێگەری



**١.** پیرۆزکردن و موقەددەس کردنی مێ (ژن)، ناشیرین کردن و نابووت کردنی پیاو و ناساندنی وەك ستەمکار لە ئافرەت و ...

**٢.** دژایەتیکردنی هاوسەرگیری و زەواجی شەرعی و ناساندنی وەك کۆیلایەتی و چوونە ژێر ڕکێفی پیاو و ....

**٣.** بانگەشەکردن بۆ هاوڕەگەزبازی و لادانی جنسی و دانانی هاوڕەگەزبازی وەك بەدیلێك بۆ هاوسەگریی شەرعی و سروشتی، یان بەکارهێنانی هەندێ ئامراز و وەسیلەی سەیر و عەجیبی وەك لاستیك و ... بۆ تێرکردنی ئارەزووە سێکسییەکان.

**٤.** دژایەتیکردنی خێزان و ناساندنی وەك قەفەسی زیندان.

**٥.** دژایەتیکردنی ئایین و دەقە ئایینییەکان و ناساندنی ئایین وەك ستەمکار لە مافەکانی مێ و ژن.

**٦.** ناساندنی ئایین و دەقەکانی وەك پیاوگەرایی و پیاوسالاری و زاڵبوونی نێر بەسەر مێدا.

**٧.** دژایەتیکردنی هەموو بەها ئەخلاقی و کۆمەڵاتی و ئایین و عورفییەکان و ناساندنیان وەك دواکەوتوویی و ....

**٨.** ژن دەبێ یاخی بێ لە پیاو، بۆیە لە کۆتاییدا وای لێدێت وەك هاوبەشی ژیان و خێزان سەیری پیاو ناکات، بەڵکو لێی یاخی دەبێت و بە چاوێکی دڕندانە و ستەمکارانەوە سەیری دەکات.

**٩.** نابووت کردنی دایکایەتی و وەچە و منداڵ خستەوە و وەسفکردنی بە کۆیلایەتی.

**١٠.** بەکاڵاکردنی ژن و لەشفرۆشی بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی ژیان.

**١١.** یاخیبوون لە ڕابردوو و کۆمەڵگە و کلتور و ئایین و عورف و ڕەسەنایەتی و هەموو بنەما و بەها بەرز و جوانەکان.

**١٢.** وەسفکردنی خۆڕووتکردنەوە و بەڕەڵایی و بێ حەیایی بە ئازادی و سەردەمی بوون و پێشکەوتن.

**١٣.** وەسفکردنی گوێڕایەڵی ژن بۆ هاوسەرەکەی بە کۆیلایەتی و ...

**١٤.** نەهێشتنی متمانەی نێوان ژن و پیاو.

**١٥.** پڕکردنی سۆشیال میدیا و ڕاگەیاندن و هونەر و فیلم و ... لە وێنە و نواندنی پڕ وروژاندنی سێکسی.

**١٦.** بەکاڵاکردنی ئافرەت.

**١٧.** وێناکردنی ئەندامانی نێری خێزان (باوك، برا، باپیرە، ....) بە ستەمکار و زاڵم پاشان یاخی بوون لێیان.

**١٨.** ئاشناكردن و هاندانی ئافرەتان بۆ مەی خواردنەوە و ماددە هۆشبەرەكان و جگەرە و ... وەك ئامرازێك بۆ پڕكردنەوەی بۆشاییە دەروونی و كۆمەڵاتییەكانیان.

**١٩.** بێبەشكردنی ئافرەت لە زەواج و ماڵ و حاڵی خۆی.

**٢٠.** تووشكردنی ئافرەتان بە زیندان و كێشەی كۆمەڵایەتی و خێزانی، چونكە بە هۆی ئەم كارانایەوە تووشی دەیان تاوان دەبن، دواتر دەخرێنە كونجی زیندان و تووشی دەیان كیشەی كۆمەڵایەتی و خێزانیش دەبن لەو نێوەندەدا، چونكە یاخیبوونە لێیان.

## ڕێکارەکانی بەرەنگاربوونەوەی بزوتنەوەی فێمێنیزم (Feminism)

بۆ بەرەنگاربوونەوە بزوتنەوەی فێمێنیزم ((Feminism دەبێ لە دوو ئاست و لاوە کار بکرێت:

**یەکەم:** ناوخۆی موسڵمانان خۆیان: بەوەی کە خۆیان بەهێز بکەن لە ڕووی فکری و کۆمەڵایەتی و خێزانی و ئەخلاقی و پەروەردەیی ...

**دووەم:** ناساندنی ئەوان وەك خۆیان و بەرەنگاربوونەوەیان بەشێوەیەکی زانستی و فکری و پەروەردەیی.

### پوختەی ڕێگاکانی بەرەنگاربوونەوە

**١.** پەروەردەکردنی تاك، بەتایبەت ئافرەت لەسەر فکر و پەروەردەی ئیسلامی هاوسەنگ.

**٢.** گرینگدانی زۆر بە خێزان و هەوڵدان بۆ پتەوکردن و ڕێگریکردن لە لێکهەڵنەوەشانی.

**٣.** هاندان بۆ هاوسەرگیری.

**٤.** گرینگیدان بە منداڵ.

**٥.** هۆشیاری و ڕەواندنەوەی گومانی فێمێنیستەکان.

**٦.** ناساندنی فێمێنیزم Feminism)) و فکر و بیروبۆچوونەکانیان و بەکارهێنانی هەموو ڕێگاکانی هۆشیاری، سۆشیال میدیا، پەرتووك، کۆڕ وسیمینار، ....

**٧.** نیشاندانی زیان و کاریگەرییە خراپەکانیان لەسەر تاك و خێزان و کۆمەڵگە و ...

**٨.** وشیاری و ئاگاداری وتاربێژان و مینمەر بۆ نوێژخوێنان.

**٩.** بەکارهێنان یاسا و دەستوور و پەڕلەمان لە بەرامبەریاندا.

**١٠.** دەرخستنی مێژووی ڕەسەنی کوردایەتی، چونکە ئەم تەوژوم و ئایدۆلۆژیایە تەواو تەواو دژە لەگەڵ هەموو مێژووی ڕابردووی کورد و ڕێبەرانی، ڕێبەرانی هەموو مەلا و شێخ و خەڵکی دیندار و ڕەسەن بوون و هەرگیز ئەم لادانە فکری و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیانەیان قبوڵ نەبووە.

**١١.** خودی ئافرەتان خۆیان لە بەرامبەر ئەم تەوژمە بێنە سەر خەت، چونکە پێش هەموو کەسێك دژی ئافرەتان خۆیانن، هەر بۆیە زۆربەی فێمێنیسەکان لە ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتیدا خەڵکی بەجێماو و ...ن.

**١٢.** کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ بەسەریاندا و هەوڵدان بۆ گفتوگۆی هێمنانە لەگەڵیاندا.

**١٣.** باوەشکردنەوە بۆ ئەوانەی بەهەڵە چوونە ناویان و هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنیان لە دەستیان.

**١٤.** دەستخۆشی و هاندانیش بۆ هەموو ئەوانەی ئینسافیان هەیە و پاشگەز دەبنەوە.

## تێبینی

وەك هەموو تەوژم و ڕێباز و فکرەکانی دیکە، فێمێنیزمیش ئاست و جۆری هەیە، هەیەتی توندی و لادانەکەی زۆر زۆرە، هەیە پلەیەك یان دوو پلە لەو نەرمترە و ئەوەندە خەستوخۆڵ و توندڕەو نییە، دەتوانین بڵێین توندڕە و میانڕە و مامناوەند، واتە سێ ئاستی سەرەکییان هەیە، دەشکرێ لە ئەوروپا و هەندێ شوێنی دونیادا لە هەندێ ڕووەوە سوود لەو فێمێنیزمە میانڕەوە وەرگیرابێت، کە هەموو هەوڵەکانی خۆی کورتهەڵێناوە لە دابینکردن و دەستەبەرکردنی مافەکانی ئافرەت، بەڵام لە کۆمەڵگەیەك کە ئیسلام هەیە و ئیسلامیش هەموو شتێکی بۆ ئافرەت دەستەبەر کردووە فێمێنیزم هیچ بەهانەیەکی نییە و جگە لە ماڵوێرانی شتێکی دیکەی لێناکەوێتەوە، ئەوان کە ڕاست دەکەن بابێن فشار بخەنە سەر دەستەڵات و پەڕلەمان و حکومەت بۆ جێبەجێکردنی ئەو مافانەی شەریعەتی ئیسلامی و یاسا داویەتی بە ئافرەت، نەوەك بێن دژایەتی ئایین و ئەخلاقی و عورفە جوانەکان و ڕەسانایەتی ئەو میلەتە قوڕبەسەرە بکەن، کە سەدان کێشەی هەیە، جا ئەوەشی بێتە سەر هەر بەجارێك لەبن دێت.

# ئافرەت لە ئیسلامدا

لەدوای ئەوەی باسی جێندەر و فێمێنیزمان کرد، پێویستە باسی تێڕوانینی ئیسلامیش بکەین لەبارەی ئافرەتەوە، هەرچەندە ئەم بابەتە زۆری دەوێت، بەڵام ئێمە لێرەدا زۆر بە کورتی باسی دەکەین.

پێش ئەوەی باسی تێڕوانینی ئیسلام بکەین بۆ ئافرەت بە پێویستی دەزانم باسی تێڕوانینەکانی دیکە بکەم زۆر بەکورتی.

## ئافرەت لە ئایین و شارستانییەکاندا

بە درێژایی مێژوو، ئافرەتان هەمیشە ناڵاندوویانە بە دەست ئەو ستەم و نادادییەی بەرانبەریان ئەنجامدراوە لە کۆمەڵگا جیاوازەکانی مرۆڤایەتی، بەشێوەیەکی گشتی ئافرەت خاوەنی هیچ ڕۆڵ و پێگە و ڕێزێك نەبووە شایستەی باس بێت، بەڵکو تەنها وەك کاڵایەك سەیر کراوە بۆ خزمەتکردن و چێژی سێکسی، بۆی نەبووە خاوەنی بۆچوونی تایبەتی خۆی بێ و لە کاتی پێویست دەریببڕێ، پێویست بووە هەمیشە بێدەنگ بێ، نەیدەتوانی نەخێر بکات بەرانبەر بەم ستەم و بێ ڕێزیانەی کە ڕووبەڕووی دەکرانەوە، هەمیشە دەژیا وەك لاشەیەکی خامۆشکراوی لێوان لێو لە هەستی خۆپێکەمبوون، دەروونێکی زامدار، وە ژیانێکی پڕ لە ستەمدیدەیی ...

مرۆڤ کاتێك سەیری ژیانی ئافرەت دەکات لە پێش ئیسلام لە ناوچە جیاوازەکانی دونیا، ڕادەچڵەکێ و موچڕکەی بە لاشەدا دێت، دۆش دادەمێنێ لەم هەموو ستەمکارییەی دەرهەق بە ئافرەتان کراوە.

## پوختەی بارووددۆخی ئافرەت لەپێش ئیسلام

**١.** وەك کۆیلە و کاڵا سەیردەکرا و مامەڵەی پێوە دەکرا.

**٣.** وەك پلە دوو و سێ سەیر دەکرا.

**٤.** وەك شووم و پیس و نەگریس و نەگبەتی و نەنگی و عەیب و عار سەیر دەکرا.

**٥.** وەك ئامرازی بەتاڵ کردنەوەی شەهوەت سەیر دەکرا.

**٦.** مافی خاوەنداریەتی و ڕادەربڕین و... نەبوو[1].

---

(١) ئەم خاڵانەی باسمانکردن دەربارەی بارووددۆخی ئافرەت لە مێژوودا و پێش هاتنی ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی بوونیان هەبووە، بەتایبەت ئەو شوێنانەی وەحی و نیگاو و پەیامی خواییان پێنەگەیشتووە، یان بە شێوێنراوی پێیان گەیشتووە، بەڵام بەدڵنیاییەوە ناتوانین بیگشتێنین بۆ هەموو شوێن و کات و بارووددۆخەکان.

## ئافرەت لە کۆمەڵگای عەرەبیدا

لە کۆمەڵگای عەرەبیدا ئافرەت نیشانەی پەستی و بێزاری و شەرمەزاری بوو، بە جۆرێك هەر لە ساتەوەختی لە دایکبوونی، مەبەستیان بوو هەر بە زیندوویی بیخەنە ژێر گڵ و زیندەبەچاڵی بکەن، هەروەك خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا بە وردی ئەم دیاردە قێزەونەی تۆمار کردووە، کە وێنای شێوەو ڕووخساری تەڵخ و ڕەش هەڵگەڕاوو گرژبوونیانمان بۆ دەکات وەك ناڕەزایی دەبڕین، لە کاتی بیستنی هەواڵی لە دایك بوونی کچێکی گوڵ ئاساو بەخشراوی خوای میهرەبان:

(وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ)[١]. واتە: خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێك لەو نەفامانە، ڕووی گرژو تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە...

(يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ)[٢]. واتە: لە داخ و خەفەتی ئەو مژدە ناخۆشە، خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی و بەتەنها (بیر دەکاتەوە): ئایا

---

(١) النحل (٥٨).

(٢) النحل (٥٩).

بیهێڵێتەوە بە زەلیلی و سووکی و بێ نرخی، یاخود زیندە بەچاڵی بکات و بیخاتە توێی خاکەوە، ئاگاداربن؟! ئای کە چەندە خراپە ئەو بڕیارەی کە دەیدەن!! (وەچەو نەوەی خۆیان زیندە بەچاڵ دەکەن).

هەروەها خوای پەروەردگار هەر لە بارەی زیندەبەچاڵ کردنی کچەکانیان، کە وەك پەڕی گوڵ بوون، ڕەخنەیان لێ دەگرێ، دەفەرموێ:

(وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ)[١]. واتە: کاتێك کچی زیندە بەچاڵکراو پرسیاری لێدەکرێت.

(بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ. التکویر)[٢]. واتە: بە چ گوناهێك، بە چ تۆمەتێك کوژرا؟!

بە جۆرێك زیندەبەچاڵکردن باو بوو لە نێو عەرەبدا، بە تایبەت لە نێو چینی هەژارەکاندا، جاری وا هەبوو تا باوکەکە لە سەفەرێك دەگەڕایەوە، کچەکەی گەورە ببوو، وە فامی پەیداکردبوو، کەچی باوکی دڵڕەق هەر زیندەبەچاڵی دەکرد، یاخود لە شوێنێکی بەرزەوە فڕێیان دەدایە خوارەوە[٣]، بەمجۆرە مۆتەکەی ئەشکەنجەو ستەمکاری لەگەڵ گەورەبوونی ئافرەتان بەردەوام بوو، لە کۆڵیان نەدەبۆوە.

---

(١) التکویر (٨).

(٢) التکویر (٩).

(٣) بە داڕوخانی مسوڵمانان جیهان چ زیانێکی لێکەوت، ل ٩٨.

بەڵێ ئافرەت لە میرات بێبەش دەکرا، موڵك و سامانی دەستی بەسەردا دەگیرا کە تەڵاق دەدرا، یاخود کە مێردەکەی دەمرد، بۆی نەبوو شوو بکاتەوە، وەك شڕە و بڕە و مەڕ و ماڵات دەفرۆشرا و هەڵدەگیرایەوە.

ئا لەم دۆخە تاریك و نا هەموارە، لە نێو هۆزی جەهلی عەرەب، بەرزە پیاوێك سەری هەڵدا و فەرمووی:

کچان مەبوغزێنن، خۆشتان بوێن، چونکە کچان گوڵی ماڵ و بەرەکەتی خێزانن، مایەی گێڕانەوەتانن لە دۆزەخ و بردنتانن بۆ بەهەشت، هیچ کەس ڕێزیان ناگرێ مەگەر ڕێزداربێ، هیچ کەس بە سووك سەیریان ناکات، مەگەر خۆی سووك بێت!

## ئافرەت لە شارستانیەتی ئیسلامیدا

هەر لە ساتەوەختی دەرکەوتنی ئیسلام، ئیدی ئافرەتان بوون بە خاوەن پێگە و پلە و ڕۆڵی خۆیان، ئینجا بۆ یەکەم جار لە مێژووی مرۆڤایەتی لە جیاتی سووکایەتی و بە کەم سەیرکردن و ئەشکەنجە و ئازاری جەستەیی و دەروونی، ئافرەتان بوون بە خاوەنی ڕێز و مەقامی بەرز، مەگەر دەگونجێ ئەم گەورەییە ڕوو لە شان و شکۆی ئافرەتان نەکات، لە کاتێکدا قورئانی مەزن پیرۆزترین پەڕتوکی خوا کە لێوان لێوە لە باسکردنی گەورەیی و شکۆ و جوانی ئافرەتان، ئایەتە دانسقەکانی قورئان بۆ یەکەم جار بوو بە گوێی مرۆڤەکاندا بچرپێنن کە پێویستە ڕێز و خۆشەویستی و جوانڕەفتاری و میرات و مافی ژیانێکی سەربەرزانە بدرێ بە ئافرەت، ئەمەش وەك ماف و شایستەی خۆی نەك چاکە لەگەڵ کردن لەلایەن ڕەگەزی بەرانبەرەوە، ئایەتە ناوازەکانی قورئانی مەزن سەبارەت بە مافی ئافرەتان تەنها لە چوارچێوەی داواکاری نەبوو، یاخود بابەتێکی ئەخلاقی بن، یان چەند ئامۆژگارییەك بن و بەس، بەڵکو یاسا و شەرع و پابەندکارە، پێویستە لەسەر کۆمەڵگا پێیانەوە پابەندبن، چونکە فەرمانەکان لەلایان خوداوە هاتوون، پاداشت و سزای لەسەرە، وە بنچینەکەی سەیرکردنی ئافرەتە وەك (مرۆڤ).

بە تێڕامان و سەرنجدان لە ژیاننامەی سەرداری مرۆڤایەتی ﷺ، دەبینرێ چۆن ئەم مرۆڤە مەزنە بە کردار و گوفتار، لە هەوڵی بەردەوامدا بووە بۆ گۆڕینی داب و نەریتە خراپەکانی کۆمەڵگا، لە بارەی خراپ ڕەفتارییان لەگەڵ ئافرەتان، هەروەك دواتر لە نێوەڕۆکی ئەم کتێبە فەرمووده و گوفتارە بەپێزەکانی ئەم زاتەت ﷺ بەرچاو دەکەوێ دەربارەی ئافرەت، ئەم زاتە مەزنە ﷺ لە ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەربازی و ئابووریدا هەمیشە هەوڵی بەخشینی پێگەی تایبەتی داوە بە ئافرەتان، بەم چەشنەی لە هەمان ئەم کۆمەڵگایەی کچ دەبووە مایەی شەرمەزاری بۆ باوك و بەزیندوویی زیندەبەچاڵ دەکرا، مرۆڤێکی پەیامدار دەرکەوت ﷺ موژدەی بەهەشتی دەدا بەو پیاوانەی کچ بەخێو دەکەن و پەروەردەیەکی جوانیان دەکەن، بەم جۆرە پاڵپشتی ڕێز و خۆشەویستی بوو بۆ ئافرەتان.

بەڵێ، هەر کاتێك فاتیمەی کچی هاتبا لەبەری هەڵدەستا، نێوچاوانی ماچ دەکرد، شوێنی خۆی بۆ چۆڵ دەکرد و دایدەنیشاند، کە تەنانەت بۆ هیچ پیاو و هاوەڵێکی ئەوەی نەدەکرد، هەروەها دەیفەرموو ﷺ: «فَاطِمَةُ بَضْعَةٌ مِنِّي فَمَنْ أَغْضَبَهَا أَغْضَبَنِي»[1]. واتە: فاتیمە بەشێکە لە من، ئەوەی تووڕەی بکات و ئازاری بدات، ئەوە منی تووڕە کردوە و ئازاری داوم، هەموو ئەم هەڵوێست و وتانەی لەنێو مرۆڤایەتییەکی دڵڕەق و دڕندە دەرهەق بە ئافرەتان دەفەرموون و پەخش و بڵاو دەبوونەوە، ئەو

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٧٦٧، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ.

ﷺ لە جێگایدا تۆوی خۆشەویستی و ڕێزی ئافرەتانی دەچاند، چونکە ئەو ﷺ خۆی تاکە سەرکردەیە هەرگیز لە ئافرەتی نەداوە، هەمیشە بە جوانترین شێوە مامەڵەی لەگەڵدا کردوون!

لە حەجیماڵئاواییدا وەسیەتی ئەم پەیامبەر و سەرکردەیە باسی میرات و تەخت و جێنشینی و سەروەت و سامان نەبوو، بەڵکو باسی جوانڕەفتاری بوو لەگەڵ ئافرەتان، ئەوەبوو پڕ بە گەرووی موبارەکی دەنگی هەڵهێنا و سێ جار فەرمووی: (وەسیەتتان پێدەکەم بە جوان مامەڵەیی لەگەڵ ئافرەتان! لە نێو خۆشتان یەکتر ڕابسپێرن بە چاك مامەڵەکردن لەگەڵ ئافرەتان)!

ئا ئەمە بۆ یەکەمجار بوو دوورگەی عەرەبی بە مرۆڤ و ژیاندار و هەرچی هەبوو گوێبیستی ئەم وتانە بن بۆ مافی ئافرەتان، سەرداری مرۆڤایەتی ﷺ خاوەنی سەدان فەرموودەیە کە هەر هەمووی بەڵگەیە بۆ داکۆکی کردن لە ماف و ڕۆڵ و پێگە و بە گرنگ سەیرکردنی ئافرەتان، بەرهەمی ئەم وتانە بوو کە لە پشتییەوە ژیارێکی مەزن هاتە بوون، لە جوانترین تایبەتمەندی ئەوە بوو کە بۆ یەکەمجار بوو کە مامەڵە لەگەڵ ئافرەتان دەکرا وەك مرۆڤ!

بۆیە زانایانی ئیسلام نووسین و توێژینەوەیان تەرخان کرد تایبەت بە ماف و هەق و پێویستییەکانی ئافرەت، نەوەك تەنها وەك بونەوەرێکی مێینە سەیر بکرێ، موڵك و خانوو و کاڵایەك بێ بەکرێ بدرێ و کڕین و فرۆشتنی پێوە ئەنجام بدرێ، لای نێرینە گورگ

ئاساکان بەکاربهێنرێ بۆ چێژێکی کاتی، پاشان لە کاتی پیری و لە بێکەسی و بێنازیدا پەڕاگەندەی کوچە و کۆڵان و شەقامەکان بکرێ، وەك ئەمڕۆ خۆمان ئەم واقیعە تاڵە دەبینن!

بەم شێوە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بوو بە هەڵگیرسێنەری شۆڕشێکی مەزن بۆ دەستەبەرکردنی ماف و هەق و پێگەی بەرزی ئافرەتان، ئافرەتانیش ئەم هەوڵە جوانەی ئیسلامیان پشتگوێ نەخست، بەڵکو بەم ئازایەتی و بوێرییەی ئیسلام پێی بەخشین، دەستیان کرد بە بەرجەستەکردنی ڕۆڵی پێشەنگایەتی، لە سەرجەم کایەکانی ژیان توانیان ئاڕاستەی ژیانی مرۆڤایەتی بگۆڕن، ڕۆڵی وەرچەرخان ببینن لە زۆربەی مەیدانەکانی ژیان لە بواری زانست و زانیاری و سیاسی و خێزانداری و سەرکردایەتی و بونیاتنان و پەروەردەکردنی دەیان سەرکردەو پێشەنگ... هتد[١].

---

(١) ١٠٠ فەرموودە بۆ ئافرەتان، بەهای فەرموودە، قۆناغی حەوتەم، سیروان کاکە أحمد

## ئافرەت لە قورئاندا

قورئان لە چەند ڕوویەکەوە کاری لەسەر پرسی ئافرەت کردووە، بۆنموونە:

١- گێڕانەوەی ڕێز و پێگە و ڕۆڵ و مافە خوراوەکانی.

٢- ڕاستکردنەوەی تێڕوانینە هەڵەکان لەبەرامبەریدا.

٣- دژایەتی کردن و حەرام کردنی هەموو نادادی و ناحەقییەك بەرامبەر ئافرەت و دانانی سزا بۆی.

٤- ئەم سەر بۆ ئەوسەری قورئان بگەڕێی غەیری ڕێز و ماف و بەرزڕاگرتنی قەدری ئافرەت شتێکی دیکەی دژی ئەمە بەدی ناکەی، وشەیەك، دەستەواژایەك، فەرمایشتێك نابینی بۆنی سوکایەتی یان... لێبێت.

قورئان پڕیەتی لە ماف و ڕێز و بەرگری لە ئافرەتان، بۆنموونە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ).[1]

واتە: هاوژینییان بەجوانی لەگەڵدا بەرنەسەر. مامەڵەتان با جوان و باش و چاك بێت لەگەڵیاندا.

---

(١) النساء ١٩.

یان لە مەقامی بەرگری لە ئافرەتدا دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)[(١)].

ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك و خاوەن مێرد، پاشان ناتوانن چوار کەسیش بە شایەت بهێنن، ئەوانە هەشتا قامچیان لێ بدەن و هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، ئەوانە لە ڕیزی تاوانبارو لە سنوور دەرچوو و یاخیەکاندان.

کەواتە ئەوەی بەبێ چوار شایەت (کە مەرجێکی یەکجار قورسە) بوختان بۆ ئافرەتێك بکات ئەو شتانەی تووش دەبێت:

**١.** دەبێ هەشتا داری لێبدرێت.

**٢.** هەرگیز شایەتی لێوەرناگیرێت

**٣.** دەبێتە فاسیق و مۆری فاسیقی لێدەدرێت.

وە هەروەها دەفەرموێت: (يَهَبُ لِمَن يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَاءُ الذُّكُورَ)[(٢)].

واتە: خوای گەورە بەهەرکەس کە بیەوێت تەنها کچ دەبەخشێت و بە هەرکەس کە بیەوێت کوڕ دەبەخشێت.

---

(١) النور ( ٤ ).

(٢) الشورى (٤٩).

لێرەدا خوای گەورە کچی پێشخستووە: (بەهەرکەس کە بیەوێت تەنها کچ دەبەخشێت)، خوای گەورەش هەرگیز شتێك پێش ناخات بەبێ هۆ و حیکمەت. کەواتە کچ بەخشش و دیاری خوایە و دەبێ ماف و ڕێز و پێگە و قەدری بپارێزرێت.

## ئافرەت لە فەرموودە و تێڕوانینی پێغەمبەردا ﷺ

پێغەمبەر ﷺ بە کردار و گوفتار ماف و ڕێزی ئافرەتی گێڕاوەتەوە و پاراستووە، لەوە زیاتر چی بفەرموێت: ((خِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِكُم))[١]. واتە: باشترینتان باشترینتانن بۆ ژنەکانتان (هاوسەرانتان). کەواتە پێوەری باشبوونی بە باشبوون لەگەڵ ئافرەتان داناوە!

ئێمە لێرەدا چەند فەرموودەیەك باس دەکەین، بۆ سەلماندنی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بە کردار و گوفتار ماف و ڕێزی ئافرەتی گێڕاوەتەوە و پاراستووە، ئەم ڕێز و قەدر و پاراستنەش لەسەر هەموو ئاستەکان بووە، دایك، هاوسەر (ژن)، کچ، خوشك، پوور.

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أَبَاكَ»[٢].

---

(١) أخرجه أحمد: ١٠١١٠، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ t، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: حديث صَحِيح.

(٢) أخرجه البخاري في «الأدب المفرد»: ٥، والحديث في الصحيحين بلفظ من أحق الناس بحسن صحابتي الحديث.

واتە: ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەڵێ: گوترا: (واتە: یەکێك گوتی:) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کێ زۆر چاکەکار بم؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: باوکت. (کەواتە: دایك سێ پلە لە پێش باوکەوەیە بۆ چاکە لەگەڵ کردن).

**٢-** عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا ذَبَحَ الشَّاةَ، فَيَقُولُ: «أَرْسِلُوا بِهَا إِلَى أَصْدِقَاءِ خَدِيجَةَ»[١].

واتە: دایکمان عائیشە i دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو کە مەڕێکی سەردەبڕی، بەش بەشی دەکرد و دەیفەرموو: بینێرن بۆ دۆستەکانی خەدیجە (وەك وەفا و ڕێز و خۆشەویستی بۆ خەدیجە رضي الله عنها).

**٣-** «إِنَّ أَكْمَلَ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانَاً أَحْسَنُهُمْ خُلُقَاً، وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِكُمْ»[٢].

واتە: بێگومان ئیمان تەواوترینی بڕواداران ڕەوشت جوانترینیانە، وە باشترینتان باشترینتانن بۆ ژنان، (ژنەکانتان) (هاوسەرانتان).

**٤-** «فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ.»[٣].

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٨٢١، ومسلم: ٦٤٣١.

(٢) أخرجه أحمد: ١٠١١٠، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: حديث صَحِيح.

(٣) أخرجه مسلم: ١٢١٨، وابن حبان: ١٤٥٧، عَنْ جَابِرِ (رضي الله عنه).

واتە: دەربارەی ژنان لە خوا بترسن.

٥- «اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْـرًا»[١]

واتە: (ئامۆژگارییتان دەکەم) ئامۆژگاری یەکتری بکەن دەربارەی ئافرەتان بە چاکە (واتە: بە چاکە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن).

٦- عَنِ الْعِرْبَاضِ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّه ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا سَقَى امْرَأَتَهُ مِنَ الـمَاءِ أُجِرَ»، فَأَتَيْتُ امْرَأَتِي فَسَقَيْتُهَا، وَحَدَّثْتُهَا بِـمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[٢].

واتە: عیرباض (رضي الله عنه) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: ئەگەر پیاو ئاو بداتە ژنەکەی، پاداشتی دەدرێتەوە، (جا دەڵێ:) چوومەوە بۆ لای ژنەکەم و ئاوم پێدا، وە ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستبووم، بۆم باسکرد.

٧- عَنْ أَنَسٍ رحمهما الله، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَحَدَا الْحَادِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَيْحَكَ يَا أَنْجَشَةُ! رُوَيْدَكَ بِالْقَوَارِيرِ»[٣].

واتە: ئەنەس رحمهما الله، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرێکدا بوو، وشترەوانەکەش وشترەکانی خستبووە پێشی خۆی و گۆرانی دەگوت

---

(١) أخرجه البخاري: ٣١٥٣، ومسلم: ١٤٦٨، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه).

(٢) أخرجه أَحْمَد: ١٧١٩٥، قَالَ شعيب الأرنؤوط: صحيح بِشَوَاهِدِهِ.

(٣) أخرجه أحمد: ١٣٦٩٥، والبخاري: ٦٢٠٩، ومسلم: ٢٣٢٣.

تاکو هانیان بدات لەسەر ڕۆیشتن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هاوار بۆ تۆ ئەی ئەنجەشە! لەسەرخۆ و هێواش بە لەگەڵ شووشەکان (واتە: لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی سواری پشتی وشترەکان بوون)!

٨- «عَنْ عَائشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: سَابَقَني النَّبيُّ ﷺ فَسبَقْتُهُ، فَلَبِثْنَا حَتَّى إِذَا أَرْهَقَنِي اللَّحْمُ سَابَقَنِي فَسَبَقَنِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: هَذِهِ بِتِلْكَ»[١].

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشبڕکێی لەگەڵ کردم، منیش پێشی کەوتم (لێم بردەوە)، پاشان بەو شێوەماینەوە هەتا (ماوەیەك، دواتر کە من قەڵە و بووم) قەڵەوی ماندووی کردم، ئینجا پێشبڕکێی لەگەڵ کردم و پێشمکەوتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە بە ئەوە (واتە: جارێك تۆ لە منت بردەوە و پێشمکەوتی، جارێکیش من تۆڵەی خۆم کردەوە و پێشتکەوتمەوە).

٩- «لاَ تَكْرَهُوا الْبَنَاتِ، فَإِنَّهُنَّ الْمُؤْنِسَاتُ الْغَالِيَاتُ»[٢].

واتە: ڕقتان لە کچان نەبێتەوە (خۆشتان بوێن)، چونکە کچەکان دڵخۆشکەری (خێزان و خانەوادەن) و ڕێزدار و بەهادارن.

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٤١٦٤، وابن حبان: ٤٦٩١، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢) أخرجه أحمد: ١٧٣٧٣، والطبراني في «الكبير»: ٨٥٦، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ t، قال الهيثمي (١٥٦/٨): فيه ابن لهيعة، وحديثه حسن، وبقية رجاله ثقات، انظر الصَّحِيحَة: ٣٢٠٦ للألباني.

**١٠-** «لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي يَعُولُ ثَلَاثَ بَنَاتٍ، أَوْ ثَلَاثَ أَخَوَاتٍ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ، إِلاَّ كُنَّ لَهُ سِتْرَاً مِنَ النَّارِ»[١].

واتە: هیچ یەکێك نییە لە ئوممەتی من سێ کچ، یان سێ خوشك بە خێو بکات، وە چاکەکار بێ لەگەڵیان، ئەوە بە دڵنیاییی بۆی دەبنە پەرچ و دەیپارێزن لە ئاگر (دۆزەخ).

ئەگەر بمانەوێت فەرموودەکانی پەیوەست بە ماف و ڕێز و پێگە و ڕۆڵی ئافرەت باس بکەین بە دەیان و سەدان فەرموودە هەیە لەم بارەوە، بەڵام لەبەر درێژبوونەوە تەنها ئەم چەند فەرموودەیەمان باسکرد، وە ئەگەر باسی ماف و ڕێز و پێگە و ڕۆڵی ئافرەت بکەین لە قورئان و شەریعەت و فکر و شارستانیەتی ئیسلامیدا ئەوە بە دەیان بەرگ پەرتووکمان پێویستە، بەڵام ئەوەی گرینگە ئەوەیە کە ئیسلام ئافرەتی وە مرۆڤ پاشان وەك ئافرەت سەیرکردووە، وە لە ڕووی مرۆڤبوون و ڕێز و پێگە و ماف هیچ جیاکارییەکی نەکردووە، تەنها ئەوەندە نەبێت ئافرەتی بە ئافرەت داناوە، پیاویش بە پیاو، مێ بە مێ، نێر بە نێر، ئەمەش خوێندنەوەی ژن و پیاوە وەك ئەوەی کە هەن، وەك حەقیقەت و سروشت و فیترەتی خۆیان، بە پێچەوانەی جێندەر کە دەیەوێت پیاو و ژن و نێر و مێ بکات بە یەك شت و هەموو جیاوازییە جەستەیی و دەروونی و .... ڕەشبکاتەوە و ڕۆڵ

---

(١) أخرجه البَيْهَقِيُّ في «شعب»: ١١٠٢٣، عَنْ عَائِشَةَ i، وَصَحَّحَهُ الألباني في «صحيح الجامع»: ٥٣٧٢.

و ئەرك و مافەکان تێکەڵ بەیەکتری بکات! کە سەرەنجامەکەی بە زیان و ڕەشبوونەوەی هەردوو ڕەگەز کۆتایی دێت و شتێکیش نامێنێت بەناوی خێزان و کۆمەڵگەی تەندروست، کەسایەتی هەردوو ڕەگەز ون دەبێت و خێزان و کۆمەڵگەکانیش بەرەو ڕووخان و داڕمان دەچن!

## ناوەڕۆك